# بسم الله الرحمن الرحيم

# الحمدلله رب العالمين اما بعد

# مورجیئە کێن و ئەقوالیان چیە و کامانەن مورجیئە

وەکو لە مسائلی کوسج دا هاتووە امامی اسحاقی کوری منصور دەفەرمووێ وتم بە امامی احمد پێناسەیەکی مورجیئەم بۆ بکە ئەویش فەرمووی ئەوانەن کە دەڵێن ئیمان بریتیە لە قول واتا عەمەلیشت نەبێ تۆ ئیمانداری

لە مسائلی ابن هانيء دا هاتووە ابن هانيء دەفەرمووێ پرسیارم کرد لە باوکی عبدالله کە دەکاتە امامی احمد یاخود پرسیاری لێکرا دەربارەی قیسی کوری مسلم ئەویش فەرمووی هەندێک لە خەلکی دەڵێن کە مورجیئە بەڵام من نازانم لێیەوە جێگیر بووە یاخود نا کەسێکی متمانە پێکراوە لە حەدیسدا اما مسعر نەمبیستوە کە ئەو رەئی مورجیئەی هەبێت بەڵام پێی وایە کە استثناء لە ئیماندا بوونی نیە (وە باسمان کرد کە

استثناء لە ئیماندا ئەوەیە هیچ کەس بەخۆی ناڵێت  ئیماندار بەڵکو دەڵێت ان شاء الله ئیماندارم یاخود ئومێدەوارم ئیماندار بم یاخود دەڵێ ئیمانم هەیە بە الله بە مەلائیکە تا کۆتایی بە پایەکانی ئیمان چونکە ئەگەر وتی ئیماندارم واتا ئەهلی بەهەشتم هیچ کەسێکیش دڵنیا نیە کە لە بەهەشتایە چونکە نازانێت ئایە لەسەر ئەو ئیمانە وەفات دەکات یاخود الله لێ وەرگرتووە یاخود هەموو ئەو کار وکردەوانەی جێبەجێ کردووە کە الله داوای لێ کردووە دوورکەوتۆتەوە لە مەنع لێکراوەکانی بۆیە دەرخستەیەک بەکاردەهێنێت کە ئومێدەوارم ئیمانداربم یان ان شاء الله ئیماندارم کە پێی دەوترێ مەسەلەی استثناء لە ئیماندا کە ئەمە عەقیدەی ئەهلی سونەیە دەربارەی ئەم بابەتە  ) بەڵام ئەهلی ئیرجاء ئەوە نابینن وە پێیان وایە هەر کەسێک وابڵێت ئەمە شەك و گومانە وە ئەهلی سونە پێیان وانیە کە ئەمە شەك بێت بە هیچ جۆرێک.

لە مەسائیلی حرب دا هاتووە حرب دەفەرمووێ پرسیار کرا لە اسحاق دەربارەی کەسێک کە دەڵێ من لەوانەم کە الله ئیمانی لە دڵدا نوسیوم واتا کەسێکی ئیماندارم لەبەر ئەوەی الله دەناسم و ئیمانم پێی هەیە ئەویش فەرمووی ئەگەر ئەم کەسە وتی پێویست ناکا نوتقی بکەم بە زوبان ئەو

ئیمانەی دڵم دەربېرم ئەوە جەهمیە تەنها پێی وابێ ئیمان لەدڵدایە ... بەڵام ئەگەر وتی پێویست دەکا ئەوەی لەدڵمدایە بە زوبانیش دەری ببرم بەڵام پێویستم بە عەمەل نیە ، عەمەل ناکەم کار و کردەوە ناکەم هەر ئیماندارم دەفەرمووێ ئەوە مورجیئەیە .

امامی خەلال وەک لە سونەیا هاتووە دەفەرمووێ هەواڵی پێدام محمدی کوری أبي هارون وە محمدی کوری جعفر کە باوکی حارث بۆی گێڕاونەتەوە کە وتراوە بە امامی احمد یاخود وتویەتی بە امامی احمد دەربارەی کەسێک کە دەڵێ ئیمان بریتیە لە قەول ئەویش فەرمووێ هەر کەسێک بڵێ ئیمان بریتیە لە قەول ئەو کەسە مورجیئەیە وە پرسیار کرا لە امامی احمد من گوێم لێی بوو دەربارەی ئیرجاء کە ئەوان کێن یاخود ئیرجاء چیە فەرمووی ئیرجاء بریتیە لەوەی کە بوترێ ئیمان بریتیە لە قەول ئەو کەسە مورجیئەیە واتا پێویستی بە عەمەل نیە ئەگەر بەدڵ اللەی ناسی بڕوای پێ کرد کەسێکی ئیماندارە ئەگەر هیچ عەمەلێک و کار و کردەوەیەکیشی نەبێت بەڵام سونەت ئەوەیە کە لە ئیماندا بڵێی ئیمان بریتیە لە قەول وە عەمەل کردن کار و کردەوە بە لاشە و بە جەستە وە ئیمان زیاد دەکا وە کەم دەکا . السنة للخلال

وه دەفەرمووێ گوێم لە امامی احمد بوو باوکی عبدالله فەرمووی وتراوە بە ابن مبارك ئايه تۆ رەئی ئيرجاء دەبينيت واتا پرسياری لیّ کراوە ئايه تۆش وەکو مورجيئه وايت وەکو مورجيئه بيردەکەيەوە ئەويش فەرمووی من دەڵێم ئيمان بريتيە لە قەول و عەمەل بەجەستە ئيتر چۆن من کەسێکی مورجيئه بم ، بەڵام مورجيئه وانابينن عەمەل لە ئيماندا هەبێت ئەگەر کەسێک عەمەليشی نەبێت ئيمانداره .

حوسەينی کوری منصور دەفەرمووێ احمدی کوری حەنبەل پێی وتم کێ لە زانايانی ئێمە وتويانه من ئيماندارم ئەويش فەرمووی نازانم کەسێکی ثيقه پێکراو لە زانايان هەبێت کە ئەم قسەيەی کردبێت امامی احمد فەرمووی کەوايه ئێمە بۆچی شتێک بڵێين کە هيچ يەکێک لە زانايانی پێش ئێمە ئەوەيان نەوتوه.

خەلال وەکو لە السنة هاتووه دەفەرمووێ هەواڵی پیّ دام يوسفی کوری موسی کە باوکی عبدالله واتا امامی احمد پرسياری لێکراوه ئايه مورجيئه

کێیه ئەویش فەرموویەتی ئەوانەن کە دەڵێن ئیمان بریتیه لە قەول بەتەنها لە وتە بە زوبان دەری ببڕی پێی وترا ئەی کەسێک کە دەڵێ ئیمان زیاد دەکا بەڵام کەم ناکا فەرمووی نازانم ئەمە چیه.

وە هەروەها امامی خەلال دەفەرمووێ هەواڵی پێدام محمدی کوری احمدی کوری واصیلی موقرئ کە باوکی عبدالله واتا امامی احمد کە پرسیاری لێ کراوە دەربارەی ئەوەی کە دەوترێ ئیمان بریتیه لە قەول لە وتە بەڵام بەبێ عەمەل بەبێ کار و کردەوە وە ئیمان زیاد دەکا بەڵام کەم ناکا فەرمووی (هذا قول المرجئة ) ئەمە قەولی مورجیئە و عەقیدەی ئیرجاء ە. السنه للخلال.

وە هەروەها امامی خەلال دەفەرمووێ یوسفی کوری عبداللەی اسكافي بۆی نوسیم کە باسی کردووە حەسەنی کوری علی کوری حوسەینی اسكافي گێراویەتەوە کە پرسیاری لە امامی احمد کردووە دەربارەی ئەو حەدیثەی کە رسول الله دەفەرمووێ (من سرته حسنته وسائته سيئته فهو مؤمن ) ئەو کەسەی کە چاکەکانی دڵخۆشی بکا وە خراپەکانی دڵتەنگ و

نارەحەتی بکا ئەوکەسە ئیمانداره ، امامی احمد باوکی عبدالله فەرمووی لێی بپرسن ئەی ئەگەر کەسێک خراپەکانی دڵخۆشی بکا ئەو کەسە چیه . السنة للخلال

امامی خەلال دەفەرمووێ هەواڵی پێدام محمدی کوری موسا وه محمدی کوری علی کە حمدانی کوری علی وراق گێراویەتیەوە دەفەرمووێ پرسیارم کرد له احمد واتا امامی احمد لەلای ئەو باسی مورجیئە کرا منیش وتم مورجیئەکان دەڵێن ئەگەر کەسێک بەدڵ الله ی ناسی ربی خۆی ناسی ئەوکەسە ئیمانداره امامی احمد فەرمووی مورجیئە واناڵێن بەڵکو جەهمیەکان دەڵێن ئیمان تەنها بریتیە له دڵ واتا تەنها بەدڵ ئیمانی دابمەزرێ ئیتر پێویست ناکا بۆی بە زوبان دەری ببرێ تەنها پێی وابێ الله هەیە وە بروای بە پایەکانی ئیمان هەبێ ئیسلامەتی هەبێ ئەو کەسە ئیمانداره لای جەهمیەکان ئەگەر بە زوبان دەری نەبرێ عەمەل و کار و کردەوەی نەبێ ، وە ئەی مورجیئە دەڵێن چی مورجیئە دەڵێن دەبێ بە زوبانیش دەری ببرێ ، جەهمیەکان دەڵێن ئەگەر کەسێک الله ی بەدڵ ناسی هیچ عەمەل و کار و کردەوەیەکیش نەبوو بە جەستەی ئەو کەسە ئیمانداره بەڵام ئەمە کوفره بۆچی ؟ لەبەر ئەوەی ابلیس علیه اللعنه رب دەناسێ الله دەناسێ (ربي بما اغويتني) کەواتە بە قەولی جەهمیەکان

ابلیسیش ئیمانداره عیاذا بالله ، بۆیه وتم مورجیئه اجتیهادیان کردووه له قولیانه فەرمووی بەراستی ئەمه تاقیکردنەوەیەکی سەختە وە ماڵ وێرانیه و تێنەگەیشتنه له ئیمان و له ئیسلامەتی.السنة للخلال

امامی خەلال دەفەرمووێ دیسان وەکو له السنة هاتووه هەواڵی پێدام محمدی کوری جعفر که باوکی حارث دەفەرمووێ امامی احمد فەرموویەتی شبابه دعوەی بۆ ئیرجاء کردووه واتا کەسێکی مورجیئه بووه وە ئێمه شتمان لێیوه نوسیوه پێش ئەوەی بزانین که ئەو ئەم قسانه دەکات واتا عەقیدەی ئیرجاء ی هەیه ، ئەو ئەی وت ئیمان بریتیه  له قەول و عەمەل بەڵام ئایه ئەو عەمەلەیه که ئەهلی سونه باسیان کردووه نوێژ کردنه ، ڕۆژوو گرتنه ، زەکات دانه ، هەموو ئەو عەمەلەی که به جەسته و به لاشه دەکرێ یاخود به ماڵ دەکرێ بەڵام ئەو ئەی وت ، شبابه ئەی وت چی کاتێک کەسێک که وتی ئیماندارم ئیمانی له دڵدا هەبوو وە به زوبانیش ئەو ئیمانەی دەربری ئەوکەسه ئیمانداره( فاذا قال فقد عمل بلسانه) ئەگەر دەری بڕی ئەوه عەمەلی کردووه عەمەلی ئەنجام داوه کەواته لای مورجیئه عەمەل بریتیه له چی ؟ تەنها بریتیه لەوەی به زوبان دەری بڕی ئیتر تۆ عەمەلت ئەنجام داوه که ئەمه ئەو پێناسه نیه که ئەهلی سونه هەیانه بۆ ئیمان واتا ئەگەر نوێژ نەکەی ، ڕۆژوو نەگری ، ئەمر به

چاکە نەکەی ، رێگری لە خراپە نەکەی  هیچ عەمەلێکت نەبێ کە بەجەستە دەکرێت  تەنها بە زوبان دەری ببڕە ئیمانەکەت، تۆ ئیمانداری امامی احمد فەرمووی ئەمە قەوڵێکی زۆر خراپە .

وە فەرمووی ابوبکری اثرم وتی گوێم لە امامی احمد بوو واتا خەلال دەفەرمووێ ابوبکری اثرم وتی گوێم لە امامی احمد بوو کە پێی وتراوە (شبابة اي شيء يقول فيه فقال الشبابة كان يرى الإرجاء ) فەرمووی شبابە ادعای بۆ ئیرجاء کردووە بۆ دینی مورجیئە بۆ عەقیدە و بیروباوەڕی مورجیئە وە فەرمووی لێی گێردراوەتەوە لە شبابەوە قەولێکی زۆر خراپتر لەمە لەم قەولانە کە گوێم لە کەس نەبوە بەم شێوەیە ئەو قسە بکات فەرمووی شبابە دەڵێ (إذا قال فقد عمل)  ئەگەر وتی ئیماندارم ئەوە ئیتر عەمەلیشی کردووە هەموو عەمەلێکی ئەنجام داوە
(الإيمان قول و عمل كما يقولون ) دەڵێت شبابە دەڵێت وەکو ئەهلی سونە ئیمان بریتیە لە قەول و عەمەل بەڵام ئەو عەمەلە نیە کە ئەهلی سونە دەڵێن. . ئەو دەڵێت کە وتی بە زوبان من ئیماندارم هەموو عەمەلێکی ئەنجام داوە جێبەجێ کردووە بە ئەندامەکانی جەستە واتا ئەگەر تەنها بە زوبان دەری ببڕێ ئەو کەسە ئیماندارێکی راستەقینەیە ، پاشان امامی

احمد فەرمووی ئەمە قەولێکی زۆر پيسە زۆر خراپە گوێم لە هيچ کەس نەبوە ئەم قسەيا بکا السنة للخلال.

هەر لە سونەی خەلالدا امامی خەلال دەفەرمووێ هەواڵی پێدام عبدالله کوری داود کە دەفەرمووێ زيادی کوری ئەيوب بۆی گێراينەوە فەرمووی گوێم لە احمدی کوری حەنبل بوو کە دەيفەرموو ئێمە قەبوڵمان نيە ئەو قسەی کە بوترێ ئێمە ئيماندارێکی راستەقينەين وەکو مورجيئە ، قەولێکی خراپە بەڵام (ولا نكفر من قاله) ئەو کەسەش کە وا دەڵێ ئێمە کافری ناکەين.

کەوابوو مورجيئە بروايان وايە ئيمان بريتيە لەوەی کەسێک لە دڵدا ئيمانی هەبێت وە بە زوبانيش دەری ببڕێت ئيتر ئەم کەسە هيچ عەمەل و کار و کردەوەيەکی نەبێت وە هەرچەند عەمەل و کار و کردەوەی خراپيشی هەبێت ئيمانداره و هيچ کێشە لە ئيمانەکەيدا نيە ، وە پێيان وايە ئيمان زياد ناکا و کەم ناکا ، وە پێيان وايە زۆر ئاسايە لايان بڵێن بەخۆيان ئێمە ئيماندارێکی راستەقينەين ، بەڵام ئەهلی سونە پێيان وايە ئيمان بريتيە لە

قول له عەقيده و بيروباوەڕ له اعتيقاد پاشان قەول و دەربڕين و نوتق كردنی به زوبان وه پاشان كار كردن و عەمەل كردن به ئەندامەكانی جەسته به لاشه بۆ بەراست زانين و چەسپاندنی ئەو ئيمانەی كه له دڵدايه بەچی به راستی دەزانی به عەمەل كردن و عەمەل ئەنجام دان وه پێيان وايه ئيمان زياد دەكا و كەم دەكا وه ناڵێن ئێمه ئيماندارێكی راستەقينەين بەڵكو دەڵێن ان شاء الله ئيماندارين يان ئێومێدەوارين ئيمانداربين .

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى اله و اصحابه اجمعين

**"طارق الكردي"**

(ئەصلی ئەم كتێبه بريتيه له وانەيەكی دەنگی و دواتر نوسراوەتەوه )

نوسينەوەی / خادمة القرأن و السنة

